# پەندی پێشینیان

# (١)

## بـــەشێعـــر

نوسەر: محی الدین برشان

مشهوربه

محیٚ دینٚ گوێڕەش

انتشارات سامرند پیرانشهر

محی الدین برشان    ۱۳۱۱

پەندی پێشینیان / نوسه ر: محی الدین برشان ( مشهور به محیَ دین گویَرِەش ــ پیرانشهر : سامرند صفحه ۳۳۰
قیمت: ۲۰۰۰۰ریال    شابک : ۹۶۴-۸۶۲۰-۳۸.۵

فهرست نویسی بر اساس اطلاعات فیپا:
اشعر کردی ــ قرن ۱۴ــ مجموعه ها . ۲. ضرب المثلهای کردی . الف عنوان.
۴ب ۷۴۳س / PIR ۳۲۵۶    ۸ ۶۲۳/۹فا

۸۴ـ ۴۷۴۲۶م    کتابخانه ملی ایران




انتشارات سامرند پیرانشهر

تلفن : ۰٤٤٤-٤٢٢٧٧٦٠

نام کتاب : پندی پیشینیان

نویسنده : محی الدین برشان

ناشر: سامرند

تیراژ: ۳۰۰۰ جلد

نوبت چاپ: اوّل ـ ۱۳۸۵-۸٦

شابك: ۹۶۴-۸۶۲۰-۳۸.۵

قیمت : ۲۰۰۰ تومان

**بسم اللەالرحمن الرحیم**

**بەنێوی خوای بەرزوبێ هاوتا**

لەهەموشاعیر،نوسەر و زانایانی کورد بەتایبەتی ئەوانەی ئەگەرێۆکۆکردنەوەی بەرهەمەبەنرخەکانی((پەندی پێشینیان))((قسەی نەستەق))جاچ(بەشێعر.چ بەنەسر ) (ئەویش لەرۆژەدشوارەکانی ژیانیان دا بەقاچاغی،دەخانوەتاریك وتنۆکەکاندا .بەشەوی رەش لەبەرفتیلەو.تەنانەت لەبەرروناکایی جغارەش نوسیویانەتەوەو رایانگرتوەو،لەهەر قولینچك وجێگایەك هەرپەند ێکی تازەشیان گوێ لێ بووە رەگەڵیان خستوتەوپێ یانەوەزیادکردۆتەوە)ئەمانە رێ پی پێشاندەری ئێمەنە شارستانییەت وفامی ئێمەبەوقوتابخانەپرپایخانەدەناسرێن،هەمبانەبۆرینەی مامۆستای هێژاوبەلیمەتی کورد«هەژارموکریانی»فەرهەنگی مامۆستای خاڵ و بەرهەمی گیوی موکوریانی وکوردستانی،زەکی بەگ وحوزنی،هەزاران گەوهەری پرلەهونەری کوردەواری کەداهێنانی ناویان لەم نامیلکەداناگونجێ.لەرۆژگارانی پرلەرەنج ومەینەت، لەگورەپانی ئەدەب وفەرهەنگی گەلە بەش خوراووڵێ قەماوە کەمان بەهەزاران پەلکەگوڵی بۆن خۆش. روباری پرلەهاواری شێعر وپەخشانیان رازاندۆتەوەو،حەولیان داوە،زۆریان سوپاس دەکەین وئەوپەری رێزیان لێ دەگرین بەهەموهێزوتواناوە.وەك ویست و.وەسیەتی ئەوبەلیمەتانە.لەپەندونەقڵ ونەزیلەکانیان کەڵك وەردەگرین؟

زاناوشاعیرانی کورد لەکاتێك دائەوپەندو قسەنەستەقانەیان کۆکردونەتەوە، حاکم هەمۆ ئەوولاتانەی کوردیان لێ ژیاون لێ براوانەبۆخاشەبرکردنی نەتەوەی کورد !تێ دەکۆشان !وجەنجەریان بۆهارپینێ ئەم گەلەی،وەکار ئێخسبتوو؟
لەحاڵێك دا ئەوپەندوقسەنەستەقانەکۆکرلونەتەوە.کوردیان خستۆتەژێربەرداشی قورسی ژیانەپرلەرەنج وئازارەکەیان وهارپویانن؟؟

لەحاڵێك دا ئەوپەندەجوانانەو،ئەوقسەنەستەقانەیان کۆکردۆتەوەکوردلەولاّتی خۆی دەرکراوەبەزۆروزۆرداری ڕاگوێزراوەو! ملّك وسامان ومـاڵ وحـاڵ ،زەوی وزارو تەنانـەت ژن ومنداڵیشیان پێ بەجێ هێشتونەو.هەڵوەدای هەندەرانیان کردونە،

لـــەحاڵێك دا ئەوپەندوقـــسەنەستەقانەکۆکراونەتەوە،کوردلەترسی پاســـەبانەکانی ڕەژیمەسـەرەڕۆتیـەکان لەقولینـچکەتاریکەکەی هـۆڵ وتەویلەپڕلەقڕنو وگەنە،لـەجێگا چۆلەکان هەر وەها لەچاڵەڕەشەکانی دەسەلاّت داران وکوردکوژان ڕاگیراون وهەمیشە لەبارتر کردنـی پەنـدی پێشینیان وقـسەنەستەقەکانیان بەئـەرکی سەرشانی خۆیـان زانیوەو،وەکوبێچوە پشیلەی بەزاری ڕایان گوێستونەوئەوکون وئەوکونیان پێ کردونـە هەتاوەدەست پیاوەکانی ڕەژیم نەکەون ولەناویان نەبەن؟؟

خوێنـــەران و،هۆگرانی،فەرهـــەنگ وکولتـــوری کـــوردی:ئـــەمنیش وەکوفەقێلـــەییکی حـوجرەی ئەومامۆستاگەورانە،بەمەبەســـتی خزمـــەت کـــردن بەگۆشـــێکی زۆربـــچوك لەبەحری بێ بنی ئەدەب و،نریت وپەندوبەیت وباوەکانی ئەم دەبەرە،کە ژینگەی بـاب وباپیرانمە،دەســـتم دلوەتەکۆڵکەکەقەڵەمەکەم،بەوهیوایانەیارمـــەتیم بـدەن ولـــەزەوقم نەدەن،هەڵەکانم بۆڕاست کەنەوەو،لەڕێنوێنێکانیش تان بەشدارم کـەن،ماڵتان ئاوابێ وگیانتان خۆش،

خوێنەری خۆشەویست وهێژا.ئەوەی لەبەردەستتان دایەودەیخوێننەوە.

((پەندی پێشینیان.قسەی نەستەق)) دەبونوسـراوەدا.یەکـەمیان دەسـێ سـەت وسـی ویەك لاپەڕەی داکربومنەتەشـێعر،بۆبوهەمیش خوایـاریێ هـەوڵی بۆدەدەم هـەرکاتێك حازربوونەویش پێش کێش بەئێوەخۆشەویستان دەکەم هیوادارم بەباشـی کـەڵکی لـێ وەربگـرن بـۆ.ولاّمـی ڕەخنـەکانیش وەك تـای لەبەرتەورداسـێ ڕاوەسـتاوم خۆوازلـە بێکەڵکـەکانیش هـەرناهێنم وخوایـاریێ وەبـەهاوکاری ئێـوەی بـەڕێزو خۆشەویـست بۆچاپی دوهەم ڕێك وپێك تریان دەکەم ئینشاالڵەوتەعالا وپێش کێشتانی دەکەمەوە.

**باخۆم بناسێنم بەئەوخۆشەویستانەی نامناسن**

ئەمن،نێوم محی دینە ونێوی بابیشم مام ڕەحیم بوو.پێم دەڵێن محی دین گوێ ڕەش چونکەمەڕحومی بابم بەدەروێش ڕەحیم گوێ ڕەش نێوبانگی دەرکردبو،

گوێڕەش وەکی سەعدی شیرازی دەڵێ نیوی گیان لەبەرێکی بەشکۆیەکەلەدوای شێری درواوپاش ماوەی ویش دەخوا بەونێوەی؟یان هەربەئەونێوانەی ئەگەدە زەمانەکانی پێشولەماڵەتازەهاتوەکانیان دەنان نێومان بەسەر دابڕاوەو ماوەتەوە، زۆربەی ماڵەکان وخەڵکی کوردەواری هەربەنێوی (نێوبانگێ) دەناسران ئەوڕۆبڕوکێك کەوتۆتەسەرشۆرەتی دەنابۆنمونەهەتانەیانگوتباماڵە(عەولاحەجاجی )لەماسوێ یاماڵە (هەمزەمیرانی) لەزەنگیاوێ کەس نەیدەزانی کێ یە.ویان فلانەکەس شورەتی چیە؟ هەرچەندبەداخەوەدەئەوزەمانیش داهێندێك لەهەڵ پەرەستەکان نێوی زۆرخەراپ خەراپ وناحەزیان لەماڵەتازەهاتوەکان دەنان؟

بەعزەکەسێکیش هەبون ولەئەوبارەیەوەولەباری ئەونێوەخەراپانەئەگەرلەخەڵکیان دەنان،زۆریش خازرجواب وزیرەك بون وجوابی زۆر.ڕەق وتەقیان بەدمی دادەدانەوە؟

**بەلام چۆونم خوێندوە ولەکویم خوێندوە؟؟**

بابم دەف ژەن ولەکاتی خۆی دا.دەنگ خۆشێکی کەم وێنەبوولەباری عیرفان وخوا ناسی دا ڕێگای تەریقەتی دەروێشایەتی هەڵبژاردبوو باوەڕەکانی خۆی بەوپەڕی قەناعەتەوە دەپاراستن .ڕەحەمتی خوای بەسەردابڕژێ وقەبری پڕبێ لەنور،

هەرلەدەورانی منداڵیمەوەکەفامم کردوتەوە،سروشتی شاخ ودۆڵی کوردستانی دەورو بەرم لەگەڵ بۆن وبەرامەی سوێسن وهەڵاڵەو،سەدان گوڵەوەنەوشەی کەژەسەربەرزە- کانی هومام وپایزیەگ ماسوێ وقەلاتێ قیتکان لەندی بابەکراوێ کێوەکانی گردەبن و کێلەسیپان تاسانئویانم،ئاوی کانیەکانی دەروەنەزەودۆڵەڕەشی وڕوباری ئاوێژەڕۆوو بەردەکانی خورینجی خەیاڵی ناسکیان ڕاکێشاوم،بەحەیران ولاوکی بەیت بێژەبەناوبا- نگەکانی ئەوڕۆژگاری وەکو«حەمەدی ئاغای»«حەمەدی بەیتان»«شێخ عەولاو»«عەلی سیکۆ»ودەیان کەسی دیکەڕازاوم،بەبلوێری شوانی مەڕی کلۆڵ ویزنێ بەلەمس

ڕاچڵەکیوم و بـەرەوفێربون ڕاپەڕیوم،وەهەرلەوکاتێوەئـەودەنگ وبۆنەخۆشـانە،فێریان کردومـەهۆگری شـێعروبەدەب بم، زۆرم پێخـۆش بـودەنگی شـێعر خوێندنەوەوشـێعر شێعرێنم گوێلێبی،وەرزی پایزی ساڵی هەزاروسیٚ سەت وبیست وشەشـی هـەتاوی کـە بـەهارێکی زۆرتاڵمـان بەجیٚهێشتبوولەداردانی قـازی موحەممـەدی نەمروهـەواڵانی لـە ڕۆژی دەی خاکەلێوەی تەمێکی تاریکیان ئێخستەسەرهەمووخاکی کوردستان وخەڵکـە کەمان تێکڕاڕەش پۆش بون وچاوبەگریان بۆلەدەست دانی ئەو قارەمان وهەواڵانی؟ بەڵیٚ پێشەوامان کەبۆتەسـەرقافڵەی شـەهیدانی کوردسـتان وزۆرلاوی دیشمان لەئـەم ڕێگایەداگیانی خۆیان بەخت کردوبەخوێنی گەشیان وڵاتەکیان ڕەنگاند وین؟،

لەئاوای ماسویٚ تەمەنم گەیشتبۆحەوت ساڵەی دەستم بەخوێندنی کرد؟

مەڕحومی بابم (جزوی عەممەی لەقورئانی) پێرۆزپیٚ دەگوتم وبـەلاٚم هەروەکومنداڵـە کانی ئەودەوران وکاتی زۆرلەخوێندنی دەترسام کەچی لەترسـی بـابم نەمـدەوێرا هـیچ بڵێم یابتوانم خۆیی لیٚ ببوێرم؟

بەڵیٚ وردەوردەخوێندم وبۆبـەهاریٚ ماڵمـان هاتەکونـدریٚ وپـاش سـاڵێکی دی ئـەوجار هاتینـەزەنگیاویٚ ئەگـەرماڵمان هاتـەزەنگیاویٚ چـونکەبابم پینەچیٚتی دەکردوبـەدمی درێشەی نانی بۆدەردەهێناین لەبەرمەینەتی نـان کـاتی دەرس دانـی بـەمن نەبولـەلای تریش،ئەوجارهەستی بەحەزی من لەخوێندن کردبوناردمی بۆلای مـەڕحوم مـەلا سـەید سمایلی قورەیشی وپـاش ئـەوڕۆژەی کەچومەخزمەت مـەلا سـەیدسمایلی لـەلای مـەلا وفەقێیان ولەمزگەوتێم دەخوێند ودەگەڵ قورئانیٚ.گولوستانی سەعدیشم دەخوێند؟

خوالیٚ خۆش بوحاجی سەیدعەولای بابی گەورەماڵی لەزەنگیاویٚ بووکەئێستاش چەند ماڵێك لەکوڕەکانی هەرلەزەنگیاویٚ ماون هەموساڵیٚ دەمانگی مەولودیٚ دامەولودنامەی دەکرد،مەولودنامەی ئـەوزەمانی ومەولودنامـەیٚ حـاجی سـەیدعەولای دەگـەڵ مـەولود نامەی ئەوڕۆجیاوازی زۆرە.مەڕحوم حـاجی سـەیدعەولا دەینـارد مـەلای،زۆرزاناودەنگ خۆشی بەموستەعیدوفەقێوەبۆمەولودنامەخوێندنەوەی بانگ دەکردن بەڕاستی شێعرە

كانی :مەوالیە.مەوالیــە. مــەوالی ،ڕەسـول اللّەیابەدڕەلیالی،ئــەی ئۆمــەتی موحەمــەدی بلّێن بەزەوق وبەسفا،سەللوعەلاموحەممەدین ســەییدی عالــەم موستــەفا. ئەوەنـدەیان كارلێ دەكردم هەرخوابۆخۆی بزانێ، ئەگەرمــەلاو فــەقێ یـان كەسـێكی دیش شێعری خوێندباوەخەریك بـوم بچمەدەزارێوە.پـاش چـوار ســالآن ئــەوجارمالّمان چۆگردەبنی ولەوێش لەخزمــەت مــەڕحوم مامۆسـتامەلا قــادری جێـژنیم دەخوێندوهــەتاقوڕانم خـتم كردوگولستانیـشم تــەواوكرد.خوێندنەكەشــم چــۆن بــو؟ بــەهاروهاوینان بەشـێكیش لــەپاییزێ كەلّــەوان بــوم بــاقی مانـدەی پایزوتــەواوی زسـتان وبــەهارێش هــەتامالآت وەدەردەكەوتن لەمزگەوتان لەدم سۆبەوئاگردان ورتەم دەهات ودەمخوێند؟

لەبیرەوەریەكانی ئەوكاتەم كتێبێكی بوستانیم لەسابلاغێ كڕی وهێندێكیشم لەخزمەت مامۆستامەلائەحمەدناوێك كەنازانم بەچ بۆنەیەك پێیـان دەگوت مەلاچوّلەكە.خوێنـدو ئەومامۆستامەلائەحمەدبەپێـچەوانەی نیـوی نیوبـانگیی پیـاوێكی زۆرزاناوگــەورەبوو قسەی بەتام خوێی زۆردەزانین بەقسەخۆشەكانی هــیچ كــەس لــەلای وەڕەز نــەدەبۆو مانای گولستان بوستانێشی زۆربەباشــی دەزانــێن بەهەموكــەلێن وقوجبنــەكانێوە شــی دەكردنەوەهەمورستەوبیتەكانی دەبردنەوەسەردەستوری حەدیس وئایــەتی قورئــانیی تێداجێ دەكردەوە،مەلایەكی فەقیرو بۆئاوەدانیەش بێ زەڕوزیان بوو،

دەئەوەدوایانــەدا ئــەوفكرەم لـێ كردۆتەوەوتەماشــای فەرهــەنگێم كردوەوجالــەزانایی مامۆستامەلائەحمەد حالّی بومەخوالێی خۆش بی وقەبریشی پڕبێ لەنور،

ئەوجارمالّەئاغای میرزایان بۆكوڕەكانی خۆیـان گـرت بـوو.ئــەمنیش لەگــەلّ كوڕەكـانی مالّەئاغای لەكن میرزایەكەی مالّەئاغای دەمخوێند،

هەم ئەوماوەیەی لەزەنگیاوێ هەم لەگردەبنیش لەمزگەوتێ لەگەلّ ڕەفیقەكانم وئەگەر دەچومەوەمالّێ لەگەلّ مەڕحومی بابم هەلی زۆرباشم بۆدەڕەخساشێعرشێعرێنم دەكرد وشێعرەباشەكانم لەبەردەكردن ولەكاتی پێویست دا دەمخوێندنەوەجاروبارەش ئەگــەر فەقێ بۆجومعانەی هاتبانەئاوەدانیەچونكەئەوسەردەمی فەقێی تەنبەلّ و بێكاریش

زۆربون وفەقێی وامەبون تـەنیاکاریان جومعاتـەوەرگرتن وخۆبـەخێوکردن بوو،دەچـوم شێعرێنم دەگەڵ دەکردن ئەوجارواچەقەسرۆیبوم مەرفەقێیەکی بەقەراغ ئاوەدانیـەش داهاتبا.دەچوم ڕێم پێ دەگرت پاش بەخێرهێنانێ وچاك وخۆشـیەخولق بۆچـونەماڵێ، شێعرێنم دەگەڵ دەکردن وپێم وابوئـەوەی ئـەمن دەیـزانم کـەس نـایزانی بـەلأم ئـەمن هیچم نەدەزانی وکەم جاری واش هەبوبییەمەوە،هەردەمدۆڕاندوکەچی دەتگـوت ئـەوە خوداخەنی کردوم کەچومەدەگەڵ فلأنەفەقێیەی شێعرێنم کردوە،

زۆرم کەڵك لێ وەردەگرتن،شێعرەکانی حافزیم زۆرپێخـۆش بـون وزۆرجـارانیش پاشـی فاتیحاخوێندنێك بۆڕوحی خواجەحافزی شیرازی شاەچراغ وشاخ نەبات بەختی خۆمان پێ بەتاقی دەکردەوەدوایەزۆرم لەشێعرەکانی لەبـەرکردبون جاروبارەلەبەرەخۆمـەوە بەنارەدەمخوێندنەوەچاك بودەنگم خۆش نەبودەنامێشکی سەری عالەمێم دەبرد،

پاشـی ئـەو.وردەخوێندنـەی وردەوردەتەمـەنم دەهاتەسـەرێ وبـەرەولاوی دەڕۆیـشتم وهەستم بەهاوکاری لەگەڵ بابم کردوویڕای بابم دەستم دابەکاری پینەچیایەتێ کەوتمـە کەوش فرۆشی ودوکانداری.عـەللاق.چەرچـێتی.دەرمـان فرۆشـی قاچاغـچێتی فەعلـەی چـی وچـی دیکەوهـەرکارێکی بـژیوی ونـانی لـێ وەدەست هاتبـادەمکرد.هـەموشمان ئەوەی دەزانـین وبەوتـەی پێـشینیان نـان لـەگیان دابـو.پێمـەڕەوگوپاڵ دوکەرستـەی زەحمەت گێشان ونان دەرێنانی ڕۆژبون،

فەعلـەیی،گاوانی و،پـاوانی کـاری پیـاوانی بـێ منـەت بون،هەرەشـەیان لـەزۆرداران، وزێردارن،دەکردوسەربلێندیش هەربۆچینی چەوساوەوهەژاران بوو!

ئەوجارلەپاییزی ساڵی ١٣٤٧هەتاوی لەکارگەی شـەریکەقەندی پیرانـشاری دامـەزرام و نەشـەی دەرس وکـەلاس هـانی دام وردە.وردەخوێنـدم ولەبـەهاری ١٣٤٩ هـەتاوی لەمەدرەسەی وەفای پیرانشاری بەشداری تاقی کردنەوەی پۆلی شەشەمی سەرەتاییم کردوبەڵگە نامەمم وەرگرت ونێستاش پلەی خوێندەواریم هەرئەوەندەیە «شەشەمێ سەرەتایی » !

هەربەوپلەوپایەی،بنچینەی ژیانێکی باشترلەپێشوم داکوتا،ئاڵ وگۆڕی گەورەم لەبیرو باوەڕدابۆپێك هات،چونکە،مەبەستم درێژەپێ دانی بەسەرهات وبیرەوەریەکانی کاتی لاوی ودواتریشم نیەجاریّهەرلێرەڕا ئەوباسەی هەڵدەبوێرم !!

ئەوپەندانەئەگەرکۆکراونەتەوەوەکی دەبیینن پەندەکە.لەلای ڕاستەی کتێبەکەی دا بەپیتی (( **سامیك** )) کامپیۆتێری نوسراوەو،ئەوەی کردومنەتە شێعریش لەلای چەپەی دابەپیتی ((**ئەلی،کاف،ساحیفا**))وپیتەکانی ئەلف وبێیەکەو.تەك شێعرەکەشم بەپیتی ((**سولایمانیای**))کامپیۆتێری نوسینەتەوە؟

دیارەپەندەکان کەم وزیادیان نیەونەوجورەی گوێم لێ بوە.یان بە نوسراوەم دیوەهەر ئاوام نوسیوەتەوە،ئەگەربەدەگمەن پیتێك لەقەڵەم کەوتبی یالەبیرچوبی. لەم نوسراوەی دا.وانەنوسرابی، دەنا.وەکی خۆی بەبێ کەم وزیادی نوسراوەنەتەوە،

بەلاّم ئەوانەی کراونەتەشێعر.دەشێعرەکەی دالەزۆرجێگایان کەم وزۆری لێ دەبینرێ یان جێگای گۆڕدراوەوپاش وپێشی پێ کراوەهەتاکراوەتەشێعر،

زۆرلەپەندەکان هەربەشێك نوسراوە.ئەوەش لەبەرئەوەیەوچونکەبۆزۆرشت وجێگایان دەکاردەکرێ بۆ.وێنە(ئەونۆرەگارانەشمان بۆبکە)(بەهەزارجەڕڕی سەقیل)

(زاخاوی کرد)(ماڵ وهەزارنیە)(هەتا.ئاوم لەدوی بێڵێ بڕوا)و...

ئەوهەژدەشێعرەی لەپێشەوەیان نوسراوە:ئی خۆیەتی،ئەوانەلەکتێبەبەنرخەکەی ( کاك عەلی مەعروف شارەزوری)نوسیومنەتەوەونەمنیش هەربەنێوی خۆی ئی خۆیەتی نوسیومن دەستم تێ نەداون وکتێبەکەم پێ ڕەنگاندوەوزۆریشی سوپاس دەکەم چونکە.کەڵکم لەکتێبەکەی وەرگرتوەونەویش زۆری زەحمەت پێوەکێشاون !

هەرچەند کاك عەلی زۆرلەپەندەکانی بەپەند.نەزانیون وگلەیی لێیان هەبوەتەنیا لەبەرئەوەی کەنەفەوتێن نوسیونێتەوە.ئەمنیش ئەوەندەی توانیومەوزانیومن کەبەکار دێن لێم هەڵبژاردون ونوسیومن وکردومنەتەشێعر،ڕەنگ بێ واهەڵکەوتبێ ئەونیوەی شێعرەی، پێش یادوای (پەندەکەی)هیچ مانایەکی نەبێ وهەربۆزنجیرەکردنی پەندەکەی بێ چونکەئەگەر ورد لێ بڕوانین شتی وان دێتە بەرچاو پێاوهەرچەندی

خۆلەئەلاولایان دەدات وبەهیچ جور.دەگەڵ نیوەکەی دیکە رێك ناکەوێبکریتـە شـێعر ولەئاخرەکەیدا وەڕەز دەبوم وبەناعیلاجی بێ نێوەرۆکیش بـا دەگـەڵ پەنـدێك یاقسە نەستەقێکدا رێکم خستۆتەوەوکردومەتەشێعرێك و؟دەی بائەوەیان هەرمێعربێ؟

بۆئەونوسراوەی پەندی پێشینیان ئەلەم سەرچاوانەکەڵکم وەرگرتوە؟

«١ » لەدەورانی مەنداڵیەم ڕا هەرچی گوێم لێ بووەهەتائەورۆ،

«٢ » پەندی پێشنیانی سەیدعەبدولحەمیدحیرەت سەجادی دەدونوسراواندا،

«٣ »پەندی پێشینیانی کاك عەلی مەعروف شارەزوری دەدونوسراواندا،

«٤ » پەندی پێشینیانی کاك قادرفەتتاحی قازی دە نوسراوەیەك دا،

«٥ » لەهێندێك ژمارەکانی گۆواری سروەی،

ئیدی ئەمن شێعری هیچ کەسێکم نەنوسیوەتەوەئەوپەندەم نوسیونەتەوەئەگەرتوانیبم بیکەمەشێعر،نەکوشێعری شاعیرانم خەراکردبێ ویانوسیبمەوە،

بەهیوای ڕەزامەندی خوێنەرانی خۆشەویست ئەم پەندانە؟

وزۆر سوپاسی ئەوزا نایانەدەکەم ڕەچەیان شکاندوەوئێمەش پێی دا دەڕۆێن،

زۆرسوپاسی مامۆستایانی بـەرێز ١.بەتایبـەتی کـاك تەهاشـامخی لەپیرانـشاری٢.کـاك مەلاعەلی ڕەحیمی مەشهوربەمەلاعەلی قەلاتەڕەشـێ لەکونـەخانێ٣.کـاك حامیدئـەمین عەشایری شێناوێ.دەکەم ئەگەروختەبەنرخەکەیان لەخوێندنـەوەی کتێبـەکانم سـەرف کردوەوڕەخنەکانیشم قبوڵ کردون وسەرلەنوێ تێکم داون ڕیکم کردونەتەوەلـەڕێنوێنێ کەشیان کەڵکێکی زۆر زۆرباشم وەرگرتوەومەنونیانم ودەست خۆشیان پێدەڵێم،

هەروەها.سوپاسی برایان بەرێوەبەرانی (کامپیۆتێری کانی)کاك عەبدوللا شەریفی.کـاك کەماڵ ئیبراهیمـی.کـاك لوقمـان بەختـەی دەکـەم زۆریـان حـەول دەگـەڵ دام بۆکـاری کامپیۆتێری ونوسینەوەی کتێبەکانم.

لەئاخری دا سوپاسی هـەموهاوکارەکان ودۆسـتانی دیکـەش دەکـەم ئەگەرخۆشـحاڵی خۆیان بوئەوکارونوسینەی دەربڕیوەودەردەبرن وکتێبانیش دەخوێننەوە.

## پـــە نـــدی پـــێـــشـــیـــنـــیـــان

✲ ✲ ✲

بابـنوسـم بـۆھـەر،پیتێ لەوپەندە
شێعر یـێك ودڵ پـێی،ئـارەزووەمەندە
زۆرەبـزانـەكـان،بـێـن ورد ببنەوە
باوێوەتریـش بێن،یـاھـەردو چـەندە
لـەقسەی نەستەق و،فـۆلكـۆروپەند
چـەندی تۆبڵەی،كـوردوادەوڵەمەندە

( الف )

ئەلف ئەوە لێەو،خـوای مەزن وگەورە
لـەھیمداد یم بێی،لـەم پێچ ودەورە

* * *

١

| | |
|---|---|
| ئابڕویان بردە | ئـابـڕوی بـردبـۆسـەر،لك وچڵی داران |
| سەرلكی داران | خـۆشـی دورخـست بـو،لەزمـان وزاران |

* * *

٢

| | |
|---|---|
| ئاتەش بازی،بەكونگی | دەی ئـاوربـازیـە و،بـەئـاوری كـایـە |
| خاڵی ناكرێ | بـۆقـون بـەتـالآن،خـۆهـەر پـێـك نـایـە |

* * *

٣

| | |
|---|---|
| ئاخر ئەمن كەراسیكم | زۆردەردی سـەریـم ،بـەپـوڵی كـڕیـوە |
| لەتۆ،زیاتردڕیوە | كـەراسـێك لـەتـۆم،زیـاتـرخـۆ دڕیـوە |

* * *

٤

| | |
|---|---|
| ئاخری،خۆی ون ناكا | لـەهـیـچ جـیـێگـاوشوێن،نـاگـیـرسـێـتـەوە |

"" "" هەرواش بەبێ جێ،ناحەسێتەوە
"" "" چاوەڕوانیێکەت،بێ هودەنابی
"" "" خۆی هەرون ناکاو،ئاخری دێتەوە

٦ * * *

**ئاخۆران باخۆرانە** ئەوجاریش لادەی،توبی ئەوخوایە
"" "" هەروەك ئاخۆران،باخۆران وایە

٧ * * *

**ئاخ وئۆخیان لێ بڕی** ئەوەندەی لێدا،بەخۆی وبەکوڕی
"" "" دواپشو.وئاخ و،ئۆخیشی لێ بڕی

٨ * * *

**ئاخیری، خێربی** ئاخیری خێربی و،من دوعام وایە
"" "" ئەگەرواش نەبێ،هەرکاری خوایە

٩ * * *

**ئادارناچی بێ دۆ** ڕانابرێ وئادار، ناچیت بەبێ دۆ
**نیسان ناچی بێ جۆ** مانگی نیسانیێش،پەیدادەبێ جۆ

١٠ * * *

**ئاداری بەسەر** تیکی دان هەموو،گەلاوکاری
**پاداری وەنەما** نەیهێشت هیچ ئادار،بەسەرپاداری

١١ * * *

**ئادەمی، تەیری** ئادەمی دەڵەی ،تەیری بێ باڵە
**بێ باڵە** شۆ ینی بن کورسی ،یاسەرمەرزاڵە

١٢ * * *

**ئاردی بەهارەوە** ئاردی بەهارەو، سەروبەری بکەی
**هەموشتی لێ دێ** لێی دێ هەرچی تۆ،بێی بیری لێ بکەی

١٣ * * *

**ئاردی خۆی دابێشتومو** بەیانی زۆر.زو،ئاردی دابێشتوە

**کە پەکیشی ڕشتوە** بەدودەستی خۆی،سەرکۆشی ڕشتوە

١٤ * * *

**ئاردی خۆراسانێ** ئاردم لێرە بێ و،لەهەورامانێ

**ترِی پۆرئامانی** پێی بەباناکرێت ،ترِی ئامانێ

١٥ * * *

**ئاڕەسوی** ئاڕەسوی بەحری،عیلم وزانینە

**بەحری عیلمە** کەسی دیم وەك ئەو،شارەزانینە

١٦ * * *

**ئازاوڕەزگاری** ڕەزگاربوین ئێمەو،ڕەبی تۆش وابی

**ماڵەخوای بی** دەك ئازاوڕەزگار، ئەومالی خوابی

١٧ * * *

**ئاسکی نەگیراو** ئاسکی نەگیراو،پێمان دەفرۆشی

**مەفرۆشە** یالەگونێ تێریان،شیری دەدۆشی

١٨ * * *

**ئاسن بەفوی** ئاسن کوابەفوی،وەجۆش هەرنایە

**گەرم دانایە** حەمامیش بەتڕان،گەرم دانایە

١٩ * * *

**ئـــاسـن بەژەنگی** ئاسن بەژەنگی،خۆی نەبێ دەی قەت

**خۆی نەبێ، ئاڕزێ** هەرنارزێ ونابێ،واکوت ولەت لەت

٢٠ * * *

**ئاسنی سارد بۆوە** نەسحەتم کردبوو،هەربۆم نەگۆڕا

مەکوتە — ئاسنی سارد بۆوە،مەکوتەلەخۆڕا

* * *

٢١

ئاش ئەگەرلەمیستن — ئاش بەهانەی بێ و،هەرلەمیستن بی

بێ، هەر دەمیزی — خوەەردەمیزێ و،تۆی بالەکن بی

* * *

٢٢

ئاش بونەوەلە پاش — لەدوری دیاربوو،پێک هاتبونەوە

شەڕی خۆشە — خۆشەپاش شەڕو،شوڕئاش بونەوە

* * *

٢٣

ئاش، بەنۆرەیە — بۆمام ئاشەوان، والێم تورەیە

"" "" — بەدرۆپێم دەڵێ و،ئاش بەنۆرەیە

* * *

٢٤

ئاش دەسوڕێ وچەقەنە، — بەرداش دەسوڕێ و،چەقنەکەی ئاشی

دم ولوتی خۆی دەشکێنی — کەپو ولوتی خۆی ، هەر دادەتاشی

* * *

٢٥

ئاش زۆرکارێ بکا، وردی — ئاش زۆرکارێ بکا،کاردەگاتەکوێ

دەهاڕێ و، دریشتیش — دەهاڕێ وردی و، دریشتیش ئەجوێ

* * *

٢٦

ئاش هاڕەی دێ — ئاشەوان حاڵیەو،ئاش تەیارنیە

وئاردی دیارنیە — هاڕەوگوڕەی دێ و، ئاردی دیارنیە

* * *

٢٧

ئاش هەرئەوەندەی دێنێ تەوە — قازانج وبەهرەی،هەرهێندەی دێنێ

ئاشەوان بی قاپێنی — ئاشەوان بۆخۆی،بێ بیقەپێنێ

* * *

٢٨

**ئاشقه،فسه‌یه** — هه‌روه‌کی نه‌یبێت،یاپیێی وه‌ك سه‌یه
"" "" — خۆی نواندوئه‌ویش،خۆئاشقه‌فسه‌یه

٢٩ * * *

**ئاشی له‌به‌رتڕان،ده‌گه‌ڕێ** — هه‌ربه‌جوته‌ترێك،ئاشی خستنه‌کار
"" "" — هاتوه‌چه‌قه‌چه‌ق،به‌هه‌ڵاوهاوار

٣٠ * * *

**ئاغاڕۆنت بداتێ،ده‌بێ** — ئاغاکه‌دایبیه‌ی ،ڕۆنی قاڵ وزه‌نگ
**شاقه‌لی چۆغه‌ی بۆبگرێوه** — ده‌نێوشاقه‌لی،چۆغه‌ی که‌بێ ده‌نگ

٣١ * * *

**ئاغا نه‌ما** — نه‌مان ویران یا،که‌م بونه‌ئاغه
**ته‌ویله‌ش نه‌ما** — ئه‌سپ وتاژیه‌که‌ش،هه‌روا یه‌ساغه

٣٢ * * *

**ئاغاو،ئاغاڕۆ** — ئاغاو،؟ئاغاڕۆ،؟ زۆربوه‌؟له‌و ناوه
"" "" — نۆکه‌رشان وملیان،بۆده‌قوڕێ ناوه
"" "" — له‌بنه‌وه‌ش چاوی،به‌تفێ ته‌رده‌کرد
"" "" — چلکاوخۆرتابلێن،خۆرزۆرگریاوه

٣٤ * * *

**ئاغاونۆکه‌رلێك ڕاست بونه‌وه** — هه‌رئاغاونۆکه‌ر،لێك قیت بونه‌وه
**فه‌رموفه‌رمویان له‌بیرچونه‌وه** — فه‌رمووقوربانیان،له‌بیرچونه‌وه

٣٥ * * *

**ئاغای داس،له** — ئاغای ئاغه‌ڵیان،کوێخای ده‌رمانی
**سه‌پان شێرەوه** — ده‌ماڵێی دانیه‌و،قه‌ت په‌لکێ نانی
"" "" — له‌برسان چ بکا،ده‌ی وه‌کوێ بڕزێ

" " لـێی دەشـاردنـەوە،زورەی سـەپـانـی
" " ئـاغـای وامـان بـوو،لـەتـەنـبـڵـیانـی
" " دەی درزیـن داسـی و،زورەی سـەپـانـی

٣٨ * * *

**ئاغای .مرو، تۆتنێ خۆشم** مـن پـەیـدام کـردوەو ،جانـازانـم تـۆش
**ومدەست کەوتوە** ئـاغـای نـاحالّی ،تـوتـنـێکـی زۆرخـۆش

٣٩ * * *

**ئاغای گوندی رۆژێك رێی وە** ئـاغـاکـەی گـونـدیـش، لـەپـیـری ولاوان
**گاوانی گوندی دمکەوێ** کـاروپـێـی دەبـێـت ،رۆژێ بـەگـاوان

٤٠ * * *

**ئافتاوموو، لەگەن حەوت** ئـافـتـاوەولـەگـەن،بـەدەسـت وتـاوبـار
**دەست شام ونەهارهیچ** لـەشـام ونـەهـار،کـەس نـیـەخـەبـەردار
**یان** " ئـافـتـاوەولـەگـەن، چـۆن ڕێـز کـراون
" " مـەجـمـەش بـەبـێ شـیـو،هـەڵپـەسێراون

٤٢ * * *

**ئاقڵ بەگەورمو** کـەلـلـەی زۆرزەلام،بێ‌مـیـێشـك وپـوکـە
**چوکەییێی نیه** قـەت ئـاقـڵ نـەبـوەو،بـەگـەورەوچـوکـە

٤٣ * * *

**ئاقڵ تایبری کردموه** ئـاقـڵـێـك تـاهـات و،بـیـری کـردەوە
**شێت لەچۆمەکەی پڕیوه** شـێـت چـۆنـەوبـەرو،خـۆی کـۆکـردەوە

٤٤ * * *

**ئاقڵزانینەوبەسالّی نیه** زانـیـن بـەهـۆشـەو،نـەکـوبـڵـەی بـەساڵ
**دمولەمەندیش بەمالّی نیه** سـامـان هـیـمـەتـەو،نـەزۆربـونـی مـاڵ

٤٥ * * *

**ئاقڵ لەدایك وبابان چاترە**
ئاقڵم پێ چاترەو،لەدایم وبابم
ئاقڵم بێ بۆهیچ،خۆمەحتەل نابم

٤٦ * * *

**ئاقڵی بەکاران دەشکێ**
ئاقڵی بەکاران،دەشکێ پێم وایە
خۆزیاهێندێکی،دیکەشی بوایە

٤٧ * * *

**ئاقڵی دەچۆکان دایە**
لینگ وزینگی درێژ،لەخۆڕوانینی
"" "" دەچۆکانی دان،ئاقڵی وزانینی

٤٨ * * *

**ئاقڵی سوکە**
سەری چی دیارنیە،هەرمویەوتوکە
"" "" لێی حاڵی بویەو،دەی ئاقڵی سوکە

٤٩ * * *

**ئاقڵی کەرێکی نیە**
وابوەنەکوبڵەی،هەرواسەرێکی
"" "" دیارە هەرنێتی،ئاقڵی کەرێکی

٥٠ * * *

**ئاقڵی وردی بەقەت کەندویە**
بەقەت کەندویە،ئەوئاقڵی وردی
بەبیروهۆشی،خۆیتی چی کردی

٥١ * * *

**ئاکاری چاکت دەوێ حورمەتی خەڵکیت لەبەربی**
دەتهەوێ جوانی،وئاکاروچاکەی
خۆشەویستیکەی،ئەوخەڵکەپاکەی
"" "" قەدرشیان چۆنی،پێویست بێ دەبی
"" "" ڕایبگری ودەنا،نابینی چاکەی

* * *

٥٢

**ئاڵەقۆقەی پرچنە**
**چۆرچۆڕەم کەوتەبنە**
**ئەم ماوەحاڵی ژنە**
**بەفرناردیە لای ئاڵەقۆقی**
**وگوتی مێردم پێ بکا،**
**ئاڵەقۆق دەبێ بەفرێ دا**
**هەر وەهاوەزعی خەراپ دەبێ و**
**دەڵێ سەبریکم لێ بگری جارێ**
**دوایەولامی بۆدەنێرمەوە،**
**ئاڵەقۆق وەختیکی بوژاوەو**
**یالێ وبژی دەرکردن وبەفریش**
**لەلایەك ڕێژنە ڕێژنەی بارانەی**
**وجاروبارەش بای شەماڵی وتاوی**
**بەرەوبەهاران وهەوای دیکەی**
**وچی وچی ئەوجارخەبەری**
**ناردبۆبەفرێ وگوتی بابێ**
**هەتامێردی پێ بکەم**
**بەفریش دەنەوحاڵی بێ**
**حاڵیەی دانەبەوجورەی**
**خوارەوەولامی بۆ**
**ئاڵەقۆقی دەنێرێتەوە**
**ئاڵەقۆقەی پرچنە**

بەفرەوبەفکری، ویستی ژن بێنێ
چەندکەسی ناردن، چونەخوازبێنی
وتیان ئاڵەقۆق، لەبەفرانئاغاوە
پەیامی شادین، بۆلات هێناوە
ببن بەهاوسەر،تامێردی پێ بکەی
لەئەوکارەی چاتر،کوادەبی چی بکەی
ئاڵەقۆق دەڵێ، بەوشوی وانامەرد
بەدی هێنەری، زۆرنەخۆشی ودەرد
بەوسەرماوسۆڵ و،ساردوکرێوەت
بەورەنگی تاڵ و،ترش ودزێوەت
سەبرم لێ بگرن ،بببۆژێمەوە
مێردی پێ دەکەم،بۆلای دێمەوە
ئاڵەقۆق دیتی،بەفری چرەوقرە
زانی بێ حاڵەو، وەزعی زۆرشرە
خۆشی ژیوەڵەو،جوانیش ژیابۆوە
کەلاڵەی ژینی، یەکجێ نابۆوە
ناردیەلای بەفرێ،پێی دامزگێنی
حازرم شوی پێ بکەم،گەرنەوژن دێنی
پێی گوت بەقاسید،زویچوو بێرەوە
ولامەکەش هەر، بۆمنی بنێرەوە
قاسید ولامیان،کەبۆهێناوە،
بەفریش بەوجورەی،ولامی داوە

**چۆرچۆرم کەوتەبنە**
**ئەم ماوەحاڵی ژنە**
"" ""
"" ""

هۆی ئاڵەقۆقەی،قرژویرچنە
چۆرچۆرەوگەرمام،واکەوتنەبنە
رۆژێکەوهاوار،والیتم قسەوماوە
ئەم ماوەحاڵێك،بۆژیانێ وژنە

* * *

٦٦

**ئاڵەقۆقێ**
**نێودوبەردان**

کەوتەنێودوبەرد،وەك ئاڵەقۆقێ
کەم ماڵەتاوان ،دڵ بۆی بتۆقێ

* * *

٦٧

**ئالیکی دوکەرانی**
**پێ بەش ناکرێ**

ئالیکی ویێبدەی،بەشی دوکەران
پێی بەش ناکرێخۆ،هەربەپێی سەران

* * *

٦٨

**ئامۆژنم نێتی نانی شەوێ**
**ئەنگوستیلەی زێری دەوێ**

ئامۆژنم نێتی،هەرنانی شەوێ
ئەنگوستیلێك و،دوبازنەی دەوێ

* * *

٦٩

**ئاوات بۆلاوان**
**عەیب نیە**

ئاوات ودڵ خواز، بەگشت بۆلاوان
حیسابیش ناکرێ، بەگوناح وتاوان

* * *

٧٠

**ئاواڵان بۆخۆت**
**دەبینێوە**

هاتوی ئاولان، وەبینی بۆخۆت
وەکی گوتت ئەوا،کوابوزدەخوابۆت

* * *

٧١

**ئاواڵی قەلێ، دندوکی پیسە**
"" ""

ناخیچێم بەقسەی،تۆونەوسەرلیسە
کێ هاورێی قەل بێ،دند وکی پیسە

* * *

٧٢

**ئاوان سەخواردی وناشەوانیش** ئاوان سەخواردی،خۆی هەڵخستەوە
**قۆنێسەی دەلستەوە** ئاشەوان کونگێ،سەی دەلێستەوە

* * *

٧٣

**ئاو جێگای خۆی** ئاو جێگای بۆخۆی،ڕوپەیدادەکا
**دەکاتەوە** چ کون ودەرزێك بێ،خۆی تێ ڕادەکا

* * *

٧٤

**ئاودەڕواو** بەقات بێ وئەوا،بێی خۆ.وەخوێنی
**خیزدەمێنی** ئاوڕۆیوەو دەڕوات ،خیزەودەمێنی

* * *

٧٥

**ئاو،ڕوناکاییە** گشت کاری من تۆ،موحتاجین بەئاو
"" "" بۆیەگوتویانە ،ڕوناکاییەئاو

* * *

٧٦

**ئاو.ڕاوەستێ** ئاوڕادەوەستێ و،ئاشجوڵێتەوە
**ئەوەڕاناوەستێ** ئەوەم وەك جیوەی،دەڕولودێتەوە
**یان** "" لەچۆم وکانیان،ئاویش ڕاوەستی
"" "" ئێستائەومامەم،قەت ڕاناوەستی

* * *

٧٨

**ئاو ڕێگای خۆی** ئاوشوێن وڕێگای،خۆی دەکاتەوە
**دەکاتەوە** لێشی ون بێ وزوو،ڕێی دەباتەوە

* * *

٧٩

**ئاو لەسەرینچاوەی** باخۆش نیشان دا،بەوشنەوبێڵە
**قوڕپاوە** ئاوەلەسەرچاوەی،قوڕپاوە لێڵە

* * *

٨٠

ئاور بەئاوری، ناکوژێتەوە
لێ قەوماو هاسان،نابوژێتەوە

"" ""
ئاوریش بەئاوری ،ناکوژێتەوە

"" ""
یارمەتی پیاوپیێ،دەبوژێتەوە

"" ""
ئاورەوبەئاوری ، ناکوژێتەوە

٨٢ * * *

ئاورکەگرتی، ئیشك و تەڕ دەسوتێ
هەرئاورێ بیگریت،ئیشك بێ یاتەر
هەموی دەسوتێن،بێ پەڵەویەك سەر

٨٣ * * *

ئاور، گەرمە
چۆن وایەونەرێ، وا ئاورگەرمە

"" ""
بێ حەیاوئابڕو، یاوابێ شەرمە

٨٤ * * *

ئاورلەگۆڕی تۆ هەڵدەستێ
لێت حاڵی بوم و،زوم گەیبۆدەستی
ئاورلەگۆڕی،تۆیەوهەڵدەستی

٨٥ * * *

ئاور نەکەوێتە کادێنی کەس
هەرتوکێ دەیکەی،بیکەی لەناکەس
نەسوتێ یاخوا،کادێنی هیچ کەس

٨٦ * * *

ئاورو ئاو، زۆر بێ ئەمانن
دوشتن لەدونیا،هەربۆ هەمانن

"" ""
ئاورەو ئاون ،زۆر بێ ئەمانن

٨٧ * * *

ئاورەسۆت کردم
بەتیری ئەوین،ئاورەسۆت کردم

"" ""
چی لەزانینیش،بوم ڕوت کردم

٨٨ * * *

**ئاورەسورەلەخۆم دورە** دەی وایان گوتوەو،خۆئاورە سورە

**قسەی جولەکەی مەنشورە** لێم دورەوقسەی،جووەی مەنشورە

٨٩ * * *

**ئاوری بن کایە** ئەگەردەیان گوت،ئاوری بن کایە

**قەت دوایی نایە** دوکەڵ وبۆنیەو،قەت دوایی نایە

٩٠ * * *

**ئاوری بن دیزەی** تاشتێکی پێ بگا،بچێتەزگ هیزەی

**خۆش دەکا** هاتوەخۆشی بکا،ئاوری بن دیزەی

٩١ * * *

**ئاوری بەری** ئەوئاورەی دەرچو،لەژێری وبەری

**دای لەسەری** هەرئەویاعیس بوو،کەوتبۆسەری

٩٢ * * *

**ئاوری تێبەردەی** پیس ترلەپاریش، دۆڕاندی کایە

**بۆسۆی لێ نایە** ئاوری تێ بەردەی ،بۆسۆی لێ نایە

"" "" ناڵم ئیحتیاجەو،نێتی دەس مایە

"" "" ئاوری تێ بەردەی،بۆسۆی لێ نایە

٩٤ * * *

**ئاوریشمی بەلابار، هەڵناگری** ئاوریشمی وێبدەی،دە بڵێ بەلابار

"" "" کوابۆت هەڵدەگری،تابازاڕی و شار

٩٥ * * *

**ئاوری گرتوە** وای ئاورگرتوەو،تۆبڵەی لەتاوان

"" "" کەوتۆتەنێوپێی،بەرگری وپاوان

٩٦ * * *

| | |
|---|---|
| **ئاوری لە چاوان** | ئـا وری لـەچـاوان ، دەبـاری دیـارە |
| **دەبارێ** | مـەزلـوم بـێ وزاڵـم ، یـاهـەروشیـارە |
| ٩٧ | * * * |
| **ئاوری لەسەر پشتی بکەیەوە** | ئاوری بکـەیتـەوە،لـەسـەرشان وملـی |
| **لەجێگای خۆی نابزوێ** | بیسـوتێت هـەموو،باسك وپشتی زلـی |
| "" "" | وەکـی دانـیـشـتـووە،نستوەدرێـژبـوە |
| "" "" | نـابـزوێ وهـەروا،دەت دوێـنـی بـەشلـی |
| ٩٩ | * * * |
| **ئاو،وئاوەدانیان،گوتوە** | چ کـون وکـاژێـرپسن، دەیـتـەنـێ تـەوە |
| "" "" | ئـاوباشـتـر گـونـدان ،دەبـیـنێ تـەوە |
| ١٠٠ | * * * |
| **ئـــــاوەو ،** | لـەدەست چـورۆیـشت، هـەروا.ئاوەوئاو |
| **ئـــــاوچو** | بـێ دەنـگ وهـەراو ، بـاس وقـاوەقـاو |
| ١٠١ | * * * |
| **ئاوەدان بێ چەمچەماڵ** | ئـاوەدان بـێ دەی،بـاخـواچـەمچـەمـاڵ |
| **کەلە.لەکەژشوان لەماڵ** | کـەرمـاڵەکـێفـەو،شـوان خـەوتـوەلـەمـاڵ |
| ١٠٢ | * * * |
| **ئاوی بەئاوری،داکرد** | زۆریـشـی کـێشـاو،سـەروبـەری کـرد |
| "" "" | ئـاوێکـی هـێنـاو،بـەئـاورەکـەی کـرد |
| "" "" | چـاکەی لـەدەست دێ،ئـەویـشی چـاکـرد |
| "" "" | ئـاوی هـێـنـاوزو ،وبـەئـاوری داکـرد |
| ١٠٤ | * * * |
| **ئاوێ بێنەو** | جـائـاوێ بـێـنـەو،دەبـشـۆ دەسـتـانـت |

دەستان بشۆ — باس وخواس تەوا و،کارەکەی جوانت
یان "" — لەخۆبومەوەو، زۆربەکاوەخۆ
"" "" — ئاوێ حازرکەو،دەستان بێنە بشۆ
١٠٦ * * *
ئاوی بێ لغاوی — ئاوی بێ لغاوی،زۆرخواردۆتەوە
خواردۆتەوە — فێرکردەی خۆتەو،لەخۆت بۆتەوە
١٠٧ * * *
ئاوی پاییزان — کەکەوتەدەستت،ئاوی پاییزان
بیدەئازیزان — خەساری مەکەو، بیدەئازیزان
١٠٨ * * *
ئاوی پایزان لەبەفراوئەکا — ئاوەکەی پایز،وێنەی بەفراوە
ئەوەی تێرنەخواچی لەئاوئەکا — تێری نەخواردبو،یان پێ نەدراوە
١٠٩ * * *
ئاوی تاڵ وسوێرت — رێزت لێ دەگرم،عەیب پۆشەکەم
دەگەڵ دەخۆمەوە — لەگەڵ تۆئاوی،تاڵیش نوش ئەکەم
١١٠ * * *
ئاوی خاوێنی — پێك هاتن ئاوا، خوشك وباب وبرا
بەدەستی داکرا — ئاوی خاوێنیان، بەدەستی داکرا
١١١ * * *
ئاوی خۆشیم — لەبەرنا خۆشیان ، رۆژتائێوارێ
لەئەوکێ ناچیتەخوارێ — ئاوی خۆش لەئەوکێم،ناچێتەخوارێ
١١٢ * * *
ئاوی خەراپ،رژاوە — وانەبوە تۆبڵەی، وای بۆلێدرا وە

| | |
|---|---|
| "" "" | ئاوی پێشوتری،خەراپ لێ ڕژا وە |
| ١١٣ | * * * |
| **ئاوی داغەی** | ئەویش خواردێوە،دوبەوپەرداغەی |
| **خواردۆتەوە** | لەئاوی ڕونی،کانیەکەی داغەی |
| ١١٤ | * * * |
| **ئاوی دەئاونگێ‌دا** | پێی وەنوساچۆن،وەك قیل وشەوتی |
| **دەکوتێ** | ئاوێ دەدەسك و،ئاونگ دادەکوتی |
| ١١٥ | * * * |
| **ئاوی، دەباڵ کە** | ئاوی دەباڵ کەی،چارەت پێ دەکرێ |
| "" "" | دێتەدەریا هەر،دەویێدادەمرێ |
| ١١٦ | * * * |
| **ئاوێ دەبێژینگێ دا** | دیتت هەرزنیان،کردەنێوڕەشکە |
| **دەکوتێ** | پورێ تۆش ئاوێ،دەبێژینگی بکە |
| ١١٦ | * * * |
| **ئاوی دەچاوان** | لەداخ یائەوەی،چی پێ نەبڕاوە |
| **گەڕاوە** | ئاوی دەهەردوك ،چاوان گەڕاوە |
| ١١٧ | * * * |
| **ئاوی دەزاری، گەڕا** | لەبەرشیرنیایی و،یاخۆشەویستی |
| "" "" | هەرپڕبولەئاو،زاری کەبیستی |
| ١١٨ | * * * |
| **ئاوی ڕۆیشتو** | پێت وابوبۆخۆی، بۆلاو دێتەوە |
| **ناگەڕێتەوە** | ئاو ڕۆیشت ڕۆیوەو،جاکوادێتەوە |
| ١١٩ | * * * |

**ئاوی شۆرباومان زیاددەکەین**

ئاوی شۆرباوی، کەمیٚ ترزۆرکەین
زەردێکەی ڕۆمان، جارێکی سورکەین

**یان** ""
زیادی بکەین کەمێك،ئاوی شۆرباویٚ
"" ""
تێرتێری لیٚ بخوا و،هەرخۆهەڵباویٚ

* * *

١٢١

**ئاوی لەئاومڕۆیه دەرکردوە**

بۆ دەری کردو ە، ئاولەئاوەڕۆ
پێم نەگوتی ئاخر، بۆلای وەی مەڕۆ

**یان** ""
لەقرتەوپرتەو،ئەوهات وچۆیە
"" ""
پێت وابوهەرچی،بوهەربوتۆیە
"" ""
مزگێنیت دەمیٚ و،لەخۆت حاڵی بە
"" ""
دەرتکردوەوئاو ،لەوئاوەڕۆیە

* * *

١٢٤

**ئاوی لەدەستی ناڕژیٚ**

ئاوی لیٚ ناڕژێن،لەقامکی دەستی
تاوابیٚ دەی تۆو،کیٚ پێی دەوەستی

* * *

١٢٦

**ئاوی گوێی بردین**

خۆئاوی گوێچکەی،بردین بەدرۆیان
دای ئاوین ئێمەش،هەرلەگوێن خۆیان

* * *

١٢٨

**ئاوێکی ئابڕوی بەری زانا نایخواتەوە**

هەرئاوێك زانا،پێی بیٚ ئابڕوبیٚ
هەر نایخواتەوە،زۆریش تینوبیٚ

* * *

١٢٩

**ئاویان بەجۆگێکی دا دەچێتەخواریٚ**

ئەودۆەبەراستی،وەك براوغەمخوار
بەجۆگێکیش دا،ئاویان دەچتەخوار

١٢١ * * *

**ئاویان بەجۆگێکی دا** تێك چونەنەقسەو،نەگوفتوگۆیەك
**ناچێتەخوارێ** ئاویشیان نارِوا،ویێگرالەجۆیەك

١٣٠ * * *

**ئاویان، لەجێی ماڵێ نا** لەوێشیان دەرکرد،زو رەپاڵیان نا
"" "" ئاویان بۆهێنا،لەجێی ماڵیان نا

١٣٢ * * *

**ئاوێ لێـــژی** ئاوێ بخۆرەوەو، بۆت بێ لەلێژی
**گۆشت گێژی** پشکێکت خواردبا،لەگۆشتی گێژی
**....ی درێـــژی** دەبێ هەیبێت و،ئەمەی فەرموبێ
"" "" خۆشەولەهی تر ،زۆر...درێژی

١٣٤ * * *

**ئاویشتێ پاش گوێیان** خستیەپاش گوێیان، زۆریشی پێچو
"" "" هەڵەم کردئەویش، وەك کاری پێشو

١٣٥ * * *

**ئاهێکی هاتەوەبەرێ** ئاهێکی تازەی، وەبەرهاتەوە
"" "" بابیری جوانتر،لەخۆبکاتەوە

١٣٦ * * *

**ئاهی نەگرفتەیە** وەوتۆی بۆرِپێزدەی،چی لێ نەزانێ
"" "" ئەوەش وەك ئاهی، نەگرفتەدانێ

١٣٧ * * *

**ئای جێت خاڵی** ئەوگوناحەی تۆم،بەستۆووەباڵی
"" "" خۆزیالیرەبای،ئەوجێی تۆم خاڵی

١٣٨ * * *

**ئۆخەی ماڵەخۆم پێم خۆش** چەندم پێخۆشەو،ئۆخەی ماڵەخۆم

**بێ دەخۆم یانەهەرناخۆم** پێم خۆش بێ دەخۆم،دەناهیچ ناخۆم

١٣٩ * * *

**ئەتۆ بەخێر و** دەبرۆ بەخێربەو،هەرمەم بینەوە

**ئەمنیش بەسلامەت** ئەمنیش بەسلامەت،باجوێ بینەوە

١٤٠ * * *

**ئەتۆ پێت وایەکەرویشکێ** ئەتۆپێت وایەو،بەردەست کراوم

**دست وپێ بەستراوم** کەرویشکێ دەست و،پێ بەستراوم

١٤١ * * *

**ئەتۆچی و** ئەتۆچی وئەمن ،چی بیڵێ بزانم

**ئەمن چم** چی نارێکت بیست،لەزاروزمانم

١٤٢ * * *

**ئەتۆلەماڵەخۆت** لەماڵەکەی خۆت،کەتۆدانیشی

**وئەمنیش لەماڵەخۆم** پسپۆری ولەزۆر، شت لێزانیشی

١٤٣ * * *

**لەئەودیوئەودیوی بیژینگێ دو** لەدولای بێژینگ ،دوژن وەك تۆومن

**ژن دانیشتبون یەك:چۆنم دەبینی** دەیگوت خۆشکێ تۆ، چۆن دەبینی من

**دەڵێ ئەتۆنەمن چۆن دەبینی** دەیگوت دادەتۆ،چۆن ئەمنت دیوە

**ئەمنیش ئاوا ئەتۆدەبینم** تۆش هەروادیاری،لەپیش چاوی من

١٤٥ * * *

**ئەتۆ کەنگی مردی** بۆیەوانالێم،تۆ،دەربار نەبی

**قەبرحازر نەبێ** خۆی لێ شیرن کەی ،یادڵخوازنەبی

"" "" — ها ڕۆژێکی من وتۆو،بەهاتەت نەبێ
"" "" — تۆ کەنگی مردی و،قەبرسازنەبێ

* * * ١٤٧

**ئەتۆ گوتت** — لەم تەون وبەستەی،ڕێم بۆدەرنەکرد
**ئەمنیش باوەڕم کرد** — تۆفەموت ئەمنیش،باوەڕم پێوکرد

* * * ١٤٨

**ئەتۆ هەر کەرەکەی خۆمی** — حەسڵە بەگزادەی،یابەچکەدۆمی
"" "" — سالآت بی وعەسکەر،سەرداری ڕۆمی
"" "" — زۆرخۆشەویستی و،بە لآم برای خۆم
"" "" — وەك جاری جاران،هەرکەرێ خۆمی

* * * ١٥٠

**ئەتۆ هەنگاوێك ومرە پێش، هەتا** — هەنگاوێك هاتی،بۆ لام تۆبزانە
**ئەمنیش دو هەنگاو بێمە پێشێ** — دو هەنگاویش دێم،بۆلات مەردانە

* * * ١٥١

**ئەجەل غەیب نسیب غەیب** — نسیبەوئەجەل،ئەودوەلەغەیبە
**ودیدارغەیبە** — لەگەڵ دیدارو،دیتنەوەش غەیبە

* * * ١٥٢

**ئەجەل هات** — ساغ بی بەهێزبی، یاهەرگێڕ وشەل
**بەکەس ناگەڕێتەوە** — کاتێ هات بەکەس،ناگرێڕێی ئەجەل

* * * ١٥٣

**ئەزچیاوتۆچیا** — ئەزبچم ونەگەر،تۆش بێی بۆچیا
**گوێلك مابەبێگیا** — گوێلکەسوردەمرێ، بەبێ ئاووگیا

* * * ١٥٤

**ئەسپت بەتەنێ** هەرخۆی بەتەنیا،ئەسپی لینگ داوە
**لینگ داوە** هەڵموساوئاوری ،وەدوای نەداوە

* * *

١٥٥

**ئەسپت تۆڕبێ و** ئەسپت تۆروژنت ،کچ بێ تاماوی
**ژنت کچ بێ** زۆرکەسەودەڵێن ،دەی خوابێ داوی

* * *

١٥٨

**ئەسپت وێدەدەم کە غاری نە دەی** ئەسپت ویدەدەم،نابی لینگی بدەی
**چۆغەت وێدەدەم دەبەری نەکەی** هارانك وچۆغەی،نەك دەستی لێ بەدەی

* * *

١٥٧

**ئەسپم نۆڕیان** ئەسپم خۆناخوا،نۆڕیەوجەوالآن
**ناخو** یاتۆبڵەی هاتبم،بەرێگری وتاڵان

* * *

١٦٠

**ئەسپی پێش کێشێ** ئەگەرکوئەسپیان،دایەی بەدیاری
**تەماشاکردنی ددانانی ناوێ** کەس نیەخۆ بنوری،لەددانی وزاری

* * *

١٦٣

**ئەسپی چاك ئالیکی** فەقیر بێ بەختی،زوروی تێ دەکات
**لەخۆی زیاددەکا** ئەسپی چاك ئالیك،لەخۆی زیاددەکات

* * *

١٥٩

**ئەسپی کوێت** ئەسپی کوێت کاتێ،بەدوای تۆدابێت
**تادەتگاتێ دێت** چارت پێ ناکرێ،تادەتگاتێ دێت

* * *

١٦٨

**ئەسپی لەڕ باشترە** ئەسپێکی لاواز،کز بێ وبارنەبەر
**لەتەویلێك کەر** زۆرم پێ چاترەو، لەدورەوەی کەر

١٥٦ * * *

**ئەسپ وژن وتفەنگ** ئەسپ وچەك وژنە،بەدەست هەركەسە
**بەكێ بی نی ویە** هەرنەوبێوانە،ساحێبەوكەسە

١٦١ * * *

**ئەسپەدارینە** ئەسپەدارینەی، دوەری بالولی
"" "" داردەست بێ قامیش،یاچرپی وشولی

١٦٢ * * *

**ئەسپیان دەكوژێ** ئەسپیان دەكوژێ، لەبن دیواری
"" "" لەبەردزوینیەی ، یا زیندەواری

١٦٤ * * *

**ئەسپێ دەدەستی دا** ئەسپێ هەلپەركێ،لەسەردودەستی
**سەرچۆپی گرتوە** سەرچۆپی گرتوەو،هەروابەمەستی

١٦٥ * * *

**ئەسپێ دەدەستیدا** لەلای دیكانەش،وەك دارستانی
**دەپارێنەوە** دەپارانەوەو،لەسەردەستانی

١٦٦ * * *

**ئەسپێی لەسەردەستی** كەمێ ئەولاتر،هێندێكی دیكەش
**هەلدەپەرێ** داوەتەوەراو،بەزمێكی دیكەش

١٦٧ * * *

**ئەستۆی** ئەستۆی رچەقوی،دەخات پێی وایە
**رەچەقوی دەخا** قازانج وبەهرەی،دەوچەندەی دایە

١٦٩ * * *

**ئەگەرئابروی خۆت دەوێ** ئەگەرتۆئابروو،حەیای خۆت دەوێ

| | |
|---|---|
| **نابی نی خەڵکیت نەویٚ** | نابی ئی خەڵکیت،لەبەرچاوکەویٚ |
| ١٧٠ | * * * |
| **ئەگەر ئەتۆ بمری،کفن زۆرە** | ئەگەرتۆبمری و،لەکۆڵ ببیەوە |
| "" "" | کفنی زۆردێنم و،زیندو نەبیەوە |
| ١٧١ | * * * |
| **ئەگەر ئەتۆ چاکتر** | من وای دەزانم و،یانە لیێم تێك چوو |
| **دەزانی،فەرمو** | ئەتۆزۆرباشتر،لێی حاڵی فەرموو |
| ١٧٢ | * * * |
| **ئەگەر ئەتۆ دەچوی** | ئەوکاتەی تۆچوی،من دەهاتمەوە |
| **ئەمن دەهاتمەوە** | دەی زوتر هاتبای،جابردیاتمەوە |
| ١٧٣ | * * * |
| **ئەگەرئەتۆرێوی** | ئەگەرتۆرێویش،بی من کلکەکەم |
| **ئەمن کلکم** | کاری شاهیدی و،چیدیشت بۆبکەم |
| ١٧٤ | * * * |
| **ئەگەر بابی خۆت خۆش دەویٚ** | ئەگەربۆبابی،خۆت زۆربەخێری |
| **جنێویٚ بەبابی خەڵکی مەدە** | جنێو بۆبابی،کەس نابی بنێری |
| ١٧٤ | * * * |
| **ئەگەر باوکمان نەدییا** | ئەگەر نەمدیبا،باوکی ئەم لاوە |
| **دەیگوت کوڕە ومزیرم** | وای خۆدا دەگرت،زیاتری لەم لاوە |
| "" "" | دەیگوت بەخوای،من کوڕی وەزیرم |
| "" "" | دەیکردین بەژێر،بەردی وکەلاوە |
| ١٧٦ | * * * |
| **ئەگەر براشوانە** | ئەوکیژەی ئەگەر،برا کەی شوانە |

**خوشكیش چاوەڕوانە**
لەدەرگاش دانیشم ،هەرچاوەڕوانە

١٧٧ * * *

**ئەگەربرسیت بونان پێخۆری ناوێ**
**خەوت هات لێفەوسەرینی ناوێ**
برسیت بونانت،پێخۆری ناوێ
خەوبێ وسەرین و،لێفەی پێ ناوێ

١٧٨ * * *

**ئەگەربوی بەمیر**
**خوای بێنەبیر**
بەگوێم كەكاتێ،كەتۆبوی بەمیر
وشیاربەوخودای،قەت نەكەی لەبیر

١٧٩ * * *

**ئەگەربویەڕێوی**
**كاڵەكانم بخۆ**
هەركاتێك بویە،ڕێوی وسیرمەخۆر
كاڵەكانی منیش،تۆبخۆهەریەزۆر

١٨٠ * * *

**ئەگەر بەد بەختی هات دەپێشدا**
**لەكیسە وقەننات دەدات**
خۆچارەڕەشی و،بەدبەختی كەهات
لەكیسەوقەنەی،دەپێشدا دەدات

١٨١ * * *

**ئەگەربەدبەختی هات پەلو**
**خواردنیش ددانی دەشكێنێ**
ئەگەربەدبەختی، هێرشت بۆبێنێ
خۆپەڵوخوارنیش،ددان دەشكێنێ

١٨٢ * * *

**ئەگەربەدوعایان ئەبوو**
**كشپەڵبەخورمائەبوو**
خۆدەبا ئەگەر،بەدوعایان بایە
لەجیات كیشپەلان،خورمایان بایە

١٨٣ * * *

**ئەگەربەرخ هەربخورێ**
**فەرقی سوارو پیادەی نیە**
ئەگەرمەربخورێ،ئەوبەرخی شین بەش
سواربێت وپیادە،هەردەكرێ بەش بەش

١٨٤ * * *

**ئەگەربەماڵی، بەمام وخاڵی** ئەوەی بەماڵەو،بەمامی وخاڵە
**ئەگەربێ ماڵی، ڕوت وڕەجاڵی** ئەوەی بێ ماڵ بێت،ڕوتە وڕەجاڵە

* * *

١٨٥

**ئەگەرپوڵت هەبو** وەختێکی هەتبو،نە یارودوژمن
**دوژمنیش دۆستە** دەبنەدۆست زۆری،وەك تۆووەك من

* * *

١٨٦

**ئەگەرپیربەنوێژە** ئەگەرفەرمویان،پیرەویەنوێژە
**ساڵیش زۆردرێژە** دەبزانن ساڵیش،چەندوورودرێژە

* * *

١٨٨

**پێی خۆش بوبەخێرادایك وباباني** پێ خۆش بوخێری،دایك وباباني
**دەنابەكوێرایە هەردوچاوانی** دەنابەكوێری،هەردوك چاوانی

* * *

١٨٧

**ئەگەرتاوان باران بگرن** گەربێت وبگرن،كێ تاوان بارە
**كەس نامێنێ** نامێنێ هیچ كەس،لەنێونەوشارە

* * *

١٨٩

**ئەگەرتاو.وساو،ئەگەربارانە** تاو.وساوبێت یان،ئەگەربارانە
**بۆكەچەڵ هەر.زەرەروزیانە** بۆكەچەڵ هەردوی،هەرزەرەوزیانە

* * *

١٩٠

**ئەگەرترس هات قەپەگۆڵ** ئەگەرترس وخۆف،بۆئەم لایە دێ
**دەپیش تاژی داهەڵدێ** گۆڵدەپێش تاژی و،تولەی داهەڵدێ

* * *

١٩١

**ئەگەر تۆخۆت لۆمە كەی** هەركەس بتوانێ،بێ خۆی لۆمەبكات
**كەس ناتوانێلۆمەت كا** هیچ كەس ناتوانێ،بێ ئەولۆمەبكات

١٩٢ * * *

**ئەگەرتۆخۆت نسحەت کەی**
**کەس نسحەتت ناکات**

ئـەگـەرتـۆبێـت و،نـسحـەت بـکـەی خۆت
لۆمـەو نـسحـەتی،خـەڵکـی نـایـەن بـۆت

١٩٣ * * *

**ئەگەر تۆمنی من دومنم**
**جیا لەکللە وگەردەنم**
"" ""
"" ""

فــیـێربــویــەودەبــڕۆ،زوزو بڵێ مــنـم
ئــەگــەرتـۆ مـن بـی و،دەی مـن دومـنـم
وردەحـیـساب و،زیـادیێـکـەت پێ بـڵێم
جـیـا لـەسـەرشـان و،کـوێـربـی دوژمـنـم

١٩٥ * * *

**ئەگەرجولەکەبەئاگر بایە**
**دەباشەمۆڵکەی ئەگربایە**

ئـەگـەرجـولـەکـەش،بـەئـاگـری بـایـە
شـەمـۆڵـکـەی دەبـو،قـەت ئـەگـرتـبـایـە

١٩٦ * * *

**ئەگەرچاك و پیرجێی هیمدادێ**
**ئەبێ، خەڵك پەڕۆیان لێ ئاهاڵێنی**

چـاك وپیـر هـیـمـدا د،لـەکـەس نـەنـوێنی
پـەڕۆوپـاڵـیـشـی ،ئـابـەن لـەشـوێنی

١٩٧ * * *

**ئەگەرچاوت نابینی**
**خۆکە پۆت کونە**

ئـەگـەرکـوچـاوت، نـابـیـنـی دەی خـۆت
خـۆتـفـینکـت کـونـن،یـاهـەرجـوت کەپۆت

١٩٨ * * *

**ئەگەرچوار پێنجین وشەشین**
**هەمون میوانی دیزمرەشین**

ئـێـمـەکـەچـوارین،پـێـنجـین وشـەشـین
هـەمـون مـیـوانـی،دیـزەڵـەی ڕەشـین

١٩٩ * * *

**ئەگەر چویە شاری کوێران**
**دەست بەچاوان بگرە**

چـۆیـە شـارێکـی،خـەڵـەکـەکـەکـوێـربـی
چـاوانـت بـگـرەو،تـۆش دەبـی فـێـربـی

٢٠٠
* * *

**ئەگەرحەیابەش کرا** ئەورۆژەی حەیاش،هات بەش کراوە

**لەماڵێ نەبوە** لەماڵێ نەبوەو،چی پێ نەبڕاوە

٢٠١
* * *

**ئەگەر خاڵی بەشی خۆت** ئەگەر تۆ خاڵی،فەرمو ها بەشت

**هەڵگرمو بڕۆنەگەر داڵی** چیدی نەت بینم،بەختی وارەشت

**هەتادوتا پڕانت پێوەنێم** لەکۆڵ نەبیەوە،کون کونی دەکەم

" " بەگوللەی تاپڕان، پاك گیان ولەشت

**یان** " بەشی خۆت بەرەو،دەبڕۆ تۆخاڵی

" " هەینە تاپڕانت،تالێ بکەم خاڵی

٢٠٤
* * *

**ئەگەرخواغەزەبی لەداری گرت** خواغەزەب لەکێ،بگرێ وبەباشی

**دەیکاتەچەقەنەی ئاشی** دەیکابەدا رو،چەقنەکەی ئاشی

٢٠٥
* * *

**ئەگەرخوات بویەیاریابێ، هەزارسوار** خوات کەبوبەیار،بۆت بێ هەزارسوار

**خوات نەبی بەیار، پیرێژنی بێکار** خوات نەبێ بەیار،پیرێژنەوڕێبوار

٢٠٦
* * *

**ئەگەرخودام یاربێ** دەی بامن خودام،هیمدا دویاربێ

**بادوژمن هەزاربێ** باکم نیەدوژمن،باچەن هەزاربێ

٢٠٧
* * *

**ئەگەرخوابردی** ئەگەرخوابردی،پاڵی بۆبدەدە

**پاڵ دەوە** ڕێگەی هومێدو،هیواش مەبڕەوە

٢٠٨
* * *

**ئەگەرخوا دای**
**پاڵ داوه**

ئەگەرخوا دایەی،دەبچوپاڵ دەوه
دا نیشەوجارجار،ریشیش بەردەوه

* * *

٢٠٩

**ئەگەرخواوەندبیدابەکەسێ**
**لەخەزێنەخۆی خاس نەپاڕەسێ**

خوابەمەیلی خۆی،بیدابەهەرکەس
پێی دەگامەردو،ڕەندبێت وناکەس

* * *

٢١٠

**ئەگەرخوایاربێ**
**شمشێرلەداربێ**

ئەوکەسانەی وا،باخوا یان یاربێ
عەیبی نیەوشمشیر،قاللۆروداربێ

* * *

٢١١

**ئەگەر خۆڵێ وەسەر ی دەکەی**
**لەدەرکی گەورەی وەسەری کە**

کەقوڕێ دەپێوی،برۆ پێش گەورەی
دەناباس مەکەو،مەچوەئەودەورەی

* * *

٢١٢

**ئەگەرخەوببابەمایه**
**کەرویێشك ئەبوبەگایه**

خۆئەگەرخەویان،کردبابەمایە
کەروێشکیش ئەبو،بکرابەگایە

* * *

٢١٤

**ئەگەرخیز**
**گوڵی کرد**

قەرارێ هەرکات،خیز بێ گوڵێ بکا
هەقی تۆش تەواو،کەماڵ دەبێ بگا

* * *

٢١٥

**ئەگەرداربۆخۆی نیسێی**
**ئەبی بۆخەڵکیشی نابێ**

ئەگەرداربۆخۆی،نیسێی هەرنەبی
سێبەری بۆمن و،بۆتۆی چۆن دەبی

* * *

٢١٦

**ئەگەردرۆشه**
**خۆشه**

ئەوباسەی کردت ،زانیم ودرۆشە
زاروکەلێمەت،لەدرۆشی خۆشە

٢١٧ * * *

**ئەگەردڵ گرتی مۆرەی دیواری** ئـەگـەردڵ گـرتـی ،مـۆرەی دیـواری

**لێت دەبێتەقەندی شاری** دەبـێـتـەشـەكـرو ،دۆشـاوی شـاری

٢١٨ * * *

**ئەگەردوری** تـاكـوئـەورۆژەی،والـێمـان دوری

**پـوری** خـۆشـەویـسـتـێكـی،وەك خـاڵ وپـوری

٢١٩ * * *

**ئەگەر دونیا ئاو بی با** دونـیـا ئـاوبـی بـاو،لـێرەتـاكـو كـوێ

**لەجێگای خۆی هەڵناستێ** هـەڵـناسـتـێ ولـەجێی،خـۆی هـەرنـابـزوێ

٢٢٠ * * *

**ئەگەردەترسی** كـوا تـۆئـەگـەركـو،وازۆردەتـرسـی

**چت داوەلەلوسی** چـت دا لـەلـوس و،پـوس وزۆربـرسـی

٢٢١ * * *

**ئەگەردەسەلاتی بوا** دەسـەولاتـی بـوا،یـاهـیـچ تـوانـاوهـێـز

**سەگ وشوانی لێك دەبەستن** لـێـكـی دەبـەسـتـن،سـەگ وشـوان بـەرێـز

٢٢٢ * * *

**ئەگەردیتیانم ئەزم** دیـتـیـانـم گـوتـیـان،كـێـی دەڵـێم ئـەزم

**ئەگەرنەیان دیتم دزم** كـەنـەشـیـان دیـتـم و،ئـەوجـارەی دزم

٢٢٣ * * *

**ئەگەررۆستەم بی لەنەوەی زاڵی** دامـنـاتـۆرۆسـتـەم ،هـەرنـەوەی زاڵ بـی

**هیچ قوتبت نابێ چونكی بێ ماڵێ** حـورمـەتـت نـاگـرن،ئـەگـەربـێ مـاڵ بـی

٢٢٤ * * *

**ئەگەر رەمەزان یان شەشەكانە** ئـەگـەررەمـەزان،یـان شـەشـەكـانـە

**بەشی من هەر چەم ودو نانە** بـەشـی مـنـی غـەریـب،چـەم ودونـانـە

٢٢٥ * * *

**ئەگەر زۆری هات** کـۆکـراوەکـان و،حـازری وحـەواڵـە

**قەباڵەبەتاڵە** هـەزاران حـوکـم و،تـاپـۆوقـەبـاڵـە

" " ئـەگـەرزۆری هـات،یـالـەروی زۆردار

" " بـوبـەڵگەنـابـن،تـێـکـرای بـەتـاڵـە

٢٢٧ * * *

**ئەگەرسەری دراوسێتیان تاشی** دراوسـێـت سـەریـان،تـاشـی هـەرکـاتـێ

**تۆش سەری بخوسێنە** سـەری بـخـوسـێـنـەو،نـۆرەو.دەگـاتـێ

٢٢٨ * * *

**ئەگەرسەری دیزەی ئاوەلابو** سـەری دیـزەڵـەی،کـەئـاوەلابـێ

**دەبێ گوریەش حەیای هەبێ** خـۆلـەلای گـوریـەش،دەبـێ حـەیـابـێ

٢٢٩ * * *

**ئەگەرشانست هەبو** ئـەوکـەسـەی شـانـسـی،هـەبـێ هـەروایـە

**سەی دەرکێشت باش دەبێ** ئـەوسـەی دەرکـێـشـی، وریـاوئـازایـە

٢٣٠ * * *

**ئەگەرشەریك باش با** کـەمـوکـێك شـەریـك،بـەبـڕوابـایـە

**خواشەریکی پەیدادەکرد** دەبـاخـوا هـێـنـدەو،زۆری لابـایـە

٢٣١ * * *

**ئەگەرشەیتان لێ بگەرێ** ئـەگـەر لـێ بگـەرێـن،دوزمـان وبـەدفـەڕ

**گورگ ومەڕ وێکڕا** لـێـی ئـەکـۆڵـنـەوە،بـەقـسـەیـاوزۆروەڕ

**ئاوێ دەخۆنەوە** وەك چـاوەڕوانـی ،دەکـرادەبـیـنـرا

" " ئـاوێـان خـواردبـاوە،وێـکـڕا گـورگ ومـەڕ

٢٢٣ * * *

ئەگەر عیلاجت نەبو،بە — عـیـلاجــت نـەبێ و،هـەربـەوحـیسابـە
حەریفی دایکت دەڵێی بابە — حـەریـفـی دایـتـەو،پـێـی دەڵـێـی بابـە

٢٢٤ * * *

ئەگەرغەریبی — حـاڵـی بـوم زانـیـم،گـەرتـۆغـەریـبـی
بۆمن حەبیبی — هـەربـۆیـەش لـەلای، مـن زۆرحـەبـیـبـی

٢٢٥ * * *

ئەگەرکاربەخۆشی پێك نەیە — کـارت بـەسـەبـرو،هـێـدیـش پـێـك نـەیـە
ناڕەحەتی زۆرلەدوایداهەیە — تـونـدوتـیـژیـەکـەی،ئـەوڕێـی دیـکـەیـە

٢٣٧ * * *

ئەگەر کاوێژی کردبا — خـۆگـۆشـتـی دەخـورا،کـاوێـژی کـردبـا
گۆشتی دەخورا — کـردبـای لـەسـەرخـۆی،ئـەوەی لابـردبـا

٢٣٨ * * *

ئەگەر کوێستان خۆری — کـوێـسـتـانـت خـواردتـا،ئـەونـواڵـەوپـاڵـە
کوا دوگەت — دوگـەت کـوا وپـاشـت،بـۆ هــەربــەتـاڵـە

٢٣٩ * * *

ئەگەرکەرن بەرانبەرن — ئـەگـەرکـوکـەریـن ،ئـەودوەبـەرابـەر
ئەگەرئێسترن سەربەسەرن — دەی بـائـێـسـتـریـن ،ئـەوجـارسـەربـەسـەر

٢٤٠ * * *

ئەگەرگران نەبی — ئـەگـەگـران نـەبێ، دەی بـۆچـی سـوك بـێ
بۆسوك بی؟ — قــۆتـری مـەوبـۆتـۆش ،بـۆسـازوبـوك بـێ

٢٤١ * * *

ئەگەرگوتت حەق — ڕاسـتـەویـەڕاسـتـیـش،هــەرواديـتـراوە

**ئاوڕادەوەستی**

وەختێ کەگوتت حەق،ئاوڕاوەستاوە

* * *

٢٤٢

**ئەگەر گوتی ماست سپیه**
**باوەڕی پێ مەکە**

بێ بۆلات وبڵێ،دیوتەسپیەماست
تۆ باوەڕنەکەی،بەپیاوی ناڕاست

* * *

٢٤٣

**ئەگەرگو خۆری، کەچکت بێنە**

"    "

لێت تورەم ئەوجار،چیدیم مەدوێنە
ئەگەرگۆخۆربی،کواکەچکت بێنە

* * *

٢٤٤

**ئەگەرگۆشت گرانه**
**نەخواردنی هاسانه**

ئەگەرتۆفەر موت،گۆشت واگرانە
باشەنەخواردنی،خۆزۆرهەرزانە

* * *

٢٤٥

**ئەگەر گوڵ نی، دڕکیش مەبە**

"    "

ڕاستیەکەی بۆمن،ئەگەرگوڵ نەبی
لەدا ڵدەو دڕوش، دورکەوی دەبی

* * *

٢٤٦

**ئەگەرگەورەبوی**
**لەبیرت دەشتەوە**

ئەگەرگەورەبوی،پاکیش بێ شیرت
هەموی ئەوانەش ،دەوروالەبیرت

* * *

٢٤٧

**ئەگەرلایەلایەی دەزانی**
**بۆخەوت نایە**

واجوان دەیزا نی،ئەولایەلایە
پێم سەیرە بۆخۆت،خەوت بۆنایە

* * *

٢٤٨

**ئەگەرلە پارەی خەڵکی نە پرسیت**
**چاوت تێرنابی وتائەمری برسیت**

ئەگەرلەسراوی،خەڵکی بپرسی
چاوت تێرنابی و،تادەمری برسی

* * *

٢٤٩

| | |
|---|---|
| **ئەگەرماتی** | دیتم ومەعلوم بۆ ، ئەگەرتۆماتی |
| **بۆدەماتی** | چ پێویستێك بۆ،مات بۆدەهاتی |

٢٥٠ * * *

| | |
|---|---|
| **ئەگەرماڵت بێ** | ئەگەرماڵت بێ،دەی تۆبەڕێ وجێی |
| **کەس ناڵێ کوڕی کێی** | کەسیش پێت ناڵێ،ئەتۆکوڕی کێی |

٢٥٢ * * *

| | |
|---|---|
| **ئەگەرمام عەلی سارەوان بێ** | هەرسارەوان بێ،عەلی وەك ئوێنێ |
| **دەزانێ وشتران لەکوێ بنوێنێ** | وشتران دەزانیت،لەکوێ بنوێنێ |

٢٥١ * * *

| | |
|---|---|
| **ئەگەر نا تخورێ بنی ڕانی** | نات خورێ بن ڕان،ئەگەربەجوانی |
| **چت لەماندونەبونێ شوانی** | بۆچیتەوماندو،نەبونیە شوانی |

٢٥٣ * * *

| | |
|---|---|
| **ئەگەرنوێ هاتن** | دەڵێن هەرکاتێ،بەرگی نوێت بۆهات |
| **کۆنەخەلاتن** | کۆنەی بۆژێردەست،بەخشینەوخەلات |

٢٥٤ * * *

| | |
|---|---|
| **ئەگەر نەتبو، شڕۆلی** | ئەگەرکو نەتبو،شڕوشەپڕێوی |
| "" "" | لەترسێ خەڵکی،چۆن خۆدەبزێوی |

٢٥٥ * * *

| | |
|---|---|
| **ئەگەر نەمدیبا باوکت** | ئەگەرنەم دیبا،یەقین باوکەکەت |
| **دەمردم لەحەسرەت دایکت** | دەمردم لەسوێ،جوانی دایکەکەت |

٢٥٦ * * *

| | |
|---|---|
| **ئەگەرنەمدیبای** | بەمن چی موکری و،هۆزی بلباسی |
| **نەمدەناسی** | خۆکەنەمدیبای،هەرنەمدەناسی |

٢٥٧ * * *

**ئەگەرنەهاتیت هات** ئەگەرنەهاتیت،بوسەی دەرکی خۆت
**سەی دەرکێشت پێت دەوەڕی** بەلورەوحەپەی،هێرشیدێنی بۆت

٢٥٨ * * *

**ئەگەر نە یخۆی، بۆت دەخۆن** هەتبێ وکەنەیخۆی،واخۆڕابێنە
"" "" بۆت دەخۆن وتۆش،زەق تێڕامێنە

٢٥٩ * * *

**ئەگەرنیزیکی** دیوتەهەرکاتێ،کەلیێ نیزیکی
**لە پلیکی** بۆبەهانەویان،هەروالەپلێکی

٢٦٠ * * *

**ئەگەرهاتت بوهەی هەی مەکە** ئەگەرهاتت بو،هەی هەی پێ ناوێ
**ئەگەرنەهاتت بووەی وەی مەکە** نەهاتیت بۆهات،وەی وەی دەرباوێ

٢٦١ * * *

**ئەگەر هاتەوە پیاوی ماڵێ** ئەگەر هاتەوە،وەك پیاوی ماڵێ
**ئەگەر نەهاتەوە زیانی ساڵێ** نەبو حیساب کە،دەی زیانی ساڵێ

٢٦٢ * * *

**ئەگەر هەبو پەستە پەستە** هەتبو خەرج کەو،هەریەستەبەسته
**ئەگەر نەبو رەق راوەستە** لێشت خەلاس بو،رەق بۆی راوەستە
"" "" چی هەتبوبیخۆو،لێی رامەوەستە
"" "" بۆت دەخۆن دەنا، هەریەستەبەستە

٢٦٤ * * *

**ئەگەر هەتبو، دەورەت پڕە** دەبزانەهەتبێ،چۆن دەوروبەرت
"" "" پەندا وەوپڕەو،تاتەپلی سەرت

٢٦٥ * * *

**ئەگەرهیچ لەهیچ نازانی** ئەگەرهیچ کارێش،لەهیچ نازانی
**پیری بگۆڕەوەبەجوانی** پیری بگۆڕەوەو ،بیدەبەجوانی

٢٦٦ * * *

**ئەگەرهیچ نازانی** دامناهیچ کارێك،تۆهەرناتوانی
**گۆچانی هەڵگرەبۆشوانی** گۆچان هەڵبگرەو،بیبەبۆشوانی

٢٦٧ * * *

**ئەلحان کارمان** نەزانی وەێڕی،جیکەوفیکەبوو
**لەجێ یەکی دیکەبو** ئێستاخۆکارمان،لەجێی دیکەبوو

٢٦٨ * * *

**ئەڵێبە پینەوپەڕۆ** دامناجانەی تۆ،بەپینەوپەڕۆ
**ئەگاتەسبەی نێومڕۆ** خۆڕاگری تاسبەی،چێشت ونیوەڕۆ

٢٦٩ * * *

**ئەم ئاشە یادانی بدەیە** ئەم ئاشە ڕێگای ،دانی بۆبکەوە
**یا،ئاوی لێ ببڕەوە** دەنا ئاوەکەی ،دەلای دی بکەوە

٢٧٠ * * *

**ئەم دەست موحتاجی** یاخوانەودەستەی،بۆهیچ خەرج وباج
**دەستی تر نەبی** نەبێ بۆدەستی ،دیکانەی موحتاج
**یان** "" من دەڵێم یاخوا، تۆش بڵێ ڕەبی
"" "" ئەودەستەت موحتاج،بەوەی دی نەبی

٢٧٢ * * *

**ئەمساڵ نەبوایە پاربوایە** ئەوساڵ نەبواهەی،پارەکەبوایە
**بۆکێکی بۆسواربکرایە** بوکەسورەکەی،بۆسواربۆایە

